# دیوانی لوتفی

## شێخ لەتیف شێخ ڕەزا بەرزنجی گڵەزەردەیی

دوا شاعیری کلاسیکی کورد لە کەرکووک

١٩٠٥- ١٩٨٩ی زایینی

ئامادەکردنی: شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی

چاپی سێیەم ٢٠١٣

ناوی کتێب: دیوانی لوتفی
بابەت: شیعر
نووسینی: شێخ لەتیف شێخ ڕەزا بەرزنجی (لوتفی)
ئامادەکردنی: شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی
پیتچنین: رزگار حەساری
زنجیرە (١٥٠) لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی روناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوک
سەرپەرشتی چاپ: نەوزاد عەلی شێخانی
دەرهێنانی هونەریی: ئەنجام سەعید بابان
چاپخانە: کارۆ
تیراژ: (٥٠٠)دانە
چاپ: چاپی سێیەم
ساڵی چاپ: ٢٠١٣ - کەرکوک



وێنەی شـــێواوم با لە دوای ژیـان

تەماشـــای بکەن دۆست و برایـان

دونیای بێ بەقـا بۆ کەس نامێنێ

پێنج و دوو ڕۆژە گەدا یا ســــــوڵتان

## پێشەکی

نەتـەوەی کـورد وەك هـەموو نەتەوەیـەکی دیکـەی ئـەم سـەر جیهانـە خاوەنی شیعرو ئـەدەبیاتی خۆیـەتیو ئـەو ئەدەبیاتەشـی بە گـەلێ بارو قۆناغـدا تێپـەڕبووە و شـاعیر و نووسـەرانمان هەریەکـە بـەپێی بـەهرەو توانـستی ئـەدەبی خۆیـان سەروچـەند خـشتو بـەردێکی بتـەویان خـستووەتە سـەر بنـچینە و دیـواری کۆشـك و تـەلاری رۆشـنبیریی نەتەوەییمانو تا هاتووە ئەو کۆشکو تەلارە بەرزتر بووەتەوە تا بووە بەو ئەدەبیاتـەی ئـەمڕۆی کورد بووە بە کالاّی بالاّی ژیانی ئابووریو کۆمەلاّیـەتی گەلەکـەمان شـاعیر رۆڵـەی کۆمەڵگـە و نەتەوەیەکەیـەتیو بەشێکی جودا نەکراوەیە لە دەورووبەری ژیانی رۆژانەیدا، بۆیە بەپێی بەرنامـەی زانستییانەی لێکۆڵینـەوەی ئـەدەبی تـا بـە چاکی لـە ژیـانی شـاعیر و چـۆنییەتی سـەرهەڵدانو پـەروەردە بـوونو پێگەیـشتنی نەکۆڵینـەوە نـاتوانین لـە شـاعیرییەتی بگـەینو شـیعرەکانی بەڕاستو دروستی هەڵسەنگێنینو نرخی رەوای خۆیان پێ بدەین بۆیـە ئێمـەش بـەر لـە هـەموو شتێك دەمانـەوێ ژیاننامـەی شـاعیرمان بخەینـە روو بـە جوانی لێی ورد ببینەوە ئینجا لەبەر رۆشناییدا شاعیرییەتیو هونـەری شیعرەکانی بەپێی جۆرو مەبەستو بابەتەکانی هەڵسەنگێنینو نرخی رەوای خۆیان پێ بدەین...

## لوتفی کێیە؟

لوتفی نازناوی شیعریی شاعیری کلاسیکی کورد (شێخ لەتیف)ی کوڕی شێخ ڕەزا شێتەی کوڕی شێخ مارف قوولەی کوڕی شێخ فەتاحی قوولەی کوڕی شێخ حەسەنی قوولەی کوڕی شێخ (محێدینی کەرکووکی) کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە. دایکی ناوی حەلاوە خانی کچی شێخ مەحموودی قوولەیە.

لوتفی لە ساڵی ١٩٠٥دا لە دێی (پەڵکانە)ی ناوچەی (قەرەحەسەن)ی سەر بە کەرکووک لە دایک بووە.

کە تەمەنی گەیشتووەتە شەش ساڵان لە دێی (قوێن پەڵك) لە ناوچەی (دوون)دا باوکی لەلای مەلا سەعیدی ملباز خستوویەتیە بەر خوێندنی قورئانی پیرۆز و چەند کتێبێکی ئاینیی لەلای خوێندووە پاشان چووتە شاری دووز لە خزمەت مەلا جەلالەدین خوێندویەتی دواتر بەرەو شاری کەرکووك چووە و چووەتە مزگەوتی (نائیب) لەلای شێخ سەتاری شێخ محەمەدی کەرەدان خوێندویەتی و لە دواییدا وەك خۆی دەڵێ لەسەر ڕاسپاردەی خوالێخۆش بوو (شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما) لەگەڵ شێخ مستەفا کە ناودارە بە (شێخ کاکە) نێردراون بۆ (دیبەگە)ی سەر بە قەزای مەخمورو دوو ساڵ لەلای (مەلا تاهیری عەڵلا)یان خوێندووەو



لە دواییدا گەڕاوەتەوە بۆ (لەیلان)ی سەر بە کەرکووك‌و لەلای (مەلا عەلائەدین) هەندێ کتێبی ئایینی خوێندووە لە پاشان چووەتە دێی (خاڵۆبازیانی)و لەلای (مەلا شەریفی سیامەنسووری) چەند ساڵێکی خوێندووە دواتر گەڕاوەتەوە کەرکووك‌و لە مزگەوتی (ئیمام قاسم) بووە بە (موستەعید)و لەلای (مەلا محەمەدی هەورامی)دا ماوەیەك خوێندوویەتی‌و لەدواییدا چووە بۆ خانەقای (سەید ئەحمەد)و لەلای (مەلا سلێمانی تورك) خوێندوویەتی‌و کە ئەم مامۆستایەشی کۆچی دوایی دەکات لەلای (مەلا عەلی ئەفەندی مودەریس دوا بابەتەکانی ئەم کتێبانەی وەکو (فەنناری)و (سەعدوڵڵا)و (ئیعانە) تەواو دەکات.

کاتێ باوکی بەسەردا کۆچی دوایی دەکات، خوشك و براکانی بەسەر لوتفی دا مانەوە ناچار بوو دەست بەرداری خوێندن ببێت و دەستی بە مەلایەتی کرد، لە گوندەکانی ناوچەی شوان و ساڵەیی و لە سەرەتای ساڵانی شەستەکان بەهۆی تێکچوونی بارودۆخ لە کوردستان دەست بەرداری مەلایەتیش بوو، ڕووی کردە شاری کەرکووك تاوەکو دوا هەناسەی لەو شارە بەسەر برد. لەبەر ئەم هۆیانەی ئاماژەمان پێ دا، جێی داخە ئەم هەموو خوێندن و تەقەللا و ماندووبوونەی لوتفی لە کاروانی خوێندنی ئایینی‌و مەلایەتیدا لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی دەستی لە خوێندن هەڵگرتووەو ئیجازەی مەلایەتی وەرنەگرتووە. تا لە ڕۆژی سێ شەممەی ڕێکەوتی ١٩٨٩/٥/٢٣ لە نەخۆشخانەی ئازادی شاری کەرکووك وەفاتی کرد، لە گۆڕستانی ڕەحیماوا بە ئامادەبوونی کوڕەکانی‌و خەڵکانی ڕەحیماواو دراوسێ و خزم و کەس‌وکار و شاعیرو پیاوماقووڵان‌و پیاوانی ئاینی‌و بەخاك سپێردرا.

پاش ئەوەی کە لوتفی لەو بەروارەی سەرەوە وەفاتی کرد. شێخ عوبێد و شێخ عمری کوڕی لوتفیو ئەدیبانو شاعیرانو نووسەرانی کەرکووك، وەکو کاك شێخ ستار بەرزنجیو کاك هەردەوێڵ کاکەییو کاك شێخ حوسێن بەرزنجیو خوالێخۆشبوو محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنەو کاك رزگاری شوانیو کاك عەبدولستار جەباری و زۆر کەسانی تر بە پەرۆشەوە بوون لە هەوڵی ئەوەدابوون، کە کۆڕێکی شایستەی بۆ بگێڕن لەبەر ئەوەی لوتفی یان بە موڵکی میللەتەکەیان دانابوو. بەڵام ئەو کاتە لە کەرکووك هیچ دەرفەتێك نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ پەنایان بردە بەر چەند کەسانێکی کوردپەروەر لە شاری هەولێر وەك: خوالێخۆشبوو، شێخ لەتیف شێخ سادق هەشەزینی، شێخ عەبدوڵڵای بابەعەلی، شێخ ئیسماعیل بەرزنجیو خوالێخۆشبوو مامۆستا مەحموود زامدار. خۆشبەختانە توانییان کۆڕێکی شایستە بە لوتفی بگێڕن، لە ١٩٨٩/٧/٦ لە هۆڵی میدیای شاری هەولێر. ئەم کۆڕە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو، و لە دەزگا راگەیاندنەکانی وەکو: رادیۆ و تەلەفزیۆن و گۆڤارو رۆژنامە کوردی و عەرەبییەکانی ئەو سەردەمە، هەر لەم کۆڕەدا چەند شاعیرو ئەدیبێك شیعرو ئەدەبیاتی خۆیان خوێندەوە دەربارەی لوتفی شاعیر، ئەوانیش ئەم بەڕێزانە بوون:

١- بەڕێز خوالێخوشبوو مامۆستا مەحموود زامدار

٢- مامۆستا ئیسماعیل شێخ ئەنوەر بەرزنجی

٣- شاعیری خوالێخۆشبوو بورهان جاهید.

٤- شاعیرو پیاوی ئاینی خوالێخۆشبوو شێخ جەمال شێخ ئەحمەد بەرزنجی / کۆیە.



٥- مامۆستا مەلا شێخ حوسێن شێخ عومەر بەرزنجی.

٦- مامۆستای خوالێخوشبوو محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە.

٧- مامۆستا مەدحەت بێ خەو.

٨- مامۆستا هەردەوێڵ کاکەیی.

٩- مامۆستا حەسیب پشدەری (رانیە)

١٠- مامۆستا شێخ ستار شێخ عەبدوڵڵا بەرزنجی.

١١- مامۆستا شێخ قادر شێخ ئیسماعیل کەسنەزان.

١٢- خاتوو پاکیزە عەبدولقادر (خاکی)

١٣- شاعیر فاتح شەیدا بەرزنجی.

١٤- هونەرمەندی گەورەی کورد مامۆستا حەمە عەلی خان.

١٥- مامۆستا کەیفی کوردستانی.

١٦- مامۆستا فەخرەدین گەرمیانی.

١٧- مامۆستا مەلا ئەنوەر حەمەدێ رەحیماوا.

١٨- مامۆستا عاسی عەلی جاف.

١٩- شێخ رەزا کوڕی لوتفی شاعیر/ لەجیاتی شێخ عوبێدی برای.

٢٠- شێخ عومەر کوڕی لوتفی/وتەی بنەماڵەی پێشکەشکرد.

٢١- ی. پرۆفیسۆر هێمن شێخ عومەر بەرزنجی.

سەرەڕای ئەمانە کۆمەڵێك بروسکەش بەدەست گەیشتنو لە کۆڕەکەدا خوێندرانەوە.

هەروەها لە ساڵی ١٩٩٢ لەلایەن برای بەڕێز مامۆستا رزگار غەفووری لە تەلەفزیۆنی کەرکووك بەشی ئەدەبیات، بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ لوتفی شاعیر تەرخان کرد.

هەر لەو کاتەوە سالآنە میدیاکان بەهەموو جۆرەکانییەوە یادی لوتفی یان کردووەتەوە..

هەروەها لە ساڵی ١٩٩٨، تیپی هاوڕێیانی کەرکووک بە سەرپەرشتی بەڕێز کاک ئیدریس حەفتەغاریو هاوڕێکانی بە بۆنەی دەرچوونی قوتابیانی پەیمانگای تەکنیکی کەرکووک توانیان کۆڕێک بۆ لوتفی شاعیر ساز بکەن، لە هۆڵی ئەندازیارانی کەرکووک. لەو کۆڕەدا زۆر لە شیعرو ئەدەبیاتەکانی شاعیر شیکرانەوەو خوێندرانەوە. هەرچەند لەو کاتەدا ئەم کۆڕە گرنگی خۆی هەبوو، لەبەر بارودۆخی سیاسی ئەوکاتە.

لە ساڵی ٢٠٠٣ بەدواوە ناوە ناوە کۆمەڵەی رۆشنبیری کەرکووک، کۆڕی ئەدەبییان بۆ ئەو کەڵە شاعیرە سازداوە.

لوتفی خوالێخۆش بوو لە ژیانیدا سێ ژنی هەبوو بەم ناوانە:

١- یەکەم هاوسەری لوتفی، (کەلسووم خان) بوو، ناوی تەواوی کەلسووم کچی سەید محەمەدی کوڕی سەید عەبدولڕەحمان بەرزنجی بوو. دایکی ناوی ئاسیا خانی کچی محەمەد کە ناسراوبوو بە حەمە دۆش. لە ساڵی ١٩٠٧لە دێی (گۆڵدەرە)ی نزیک دێی (حەساری گەورە)ی سەر بە شاری کەرکووک هاتبووە دنیاوە. پێدەچێ لە ناوەراستی ساڵەکانی سییەکان، هاوسەرگیری لەگەڵ لوتفی شاعیر کردبێت،و لە بەرواری ١٩٩٢/٣/٢ لە شاری کەرکووک کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی رەحیم ئاوا لە تەنیشت مەزارگەی لوتفی شاعیر بەخاک سپێردراوە.



کەلسووم خان، سێ کوڕو سێ کچی هەبووە بەم ناوانەی خوارەوە:

١- شێخ نورەدین
٢- شێخ عوبێد
٣- شێخ عومەر
٤- خاتوو شەعریەخان / وەفاتی کردووە.
٥- خاتوو قەدریەخان / وەفاتی کردووە.
٦- خاتوو فەهیمەخان.

٢- دووەم هاوسەری لوتفی شاعیر، (عەتیە خان) ناوی تەواوی عەتیەی کچی شێخ حەسەن کوڕی شێخ محەمەدەمین کوڕی شێخ ئیسماعیل دێلێژەیە. بە رەگەز لە سەیدەکانی گوندی دێلێژە بوون. (واتە بەرزنجی بوون)

دایکی ناوی خاتوو عاسیمەی کچی شێخ محەمەد بوو. لە ساڵی ١٩٢٢ لە دێی دێلێژەی سەر بە ناحیەی قەرەداخ لە سنووری پارێزگای سلێمانی هاتبووە دنیاوە.

لە سەرەتای ساڵانی چلەکانەوە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو زاتە خوالێخۆش بووە کردبوو.

خاتوو عەتییە لە کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١ لە شاری شنۆی ئێران لە کۆمەڵگای هەڵەبجە، لە گوندی (بێمزورتێ) لە شەوی ١٩٩١/٤/٢٣ کۆچی دوایی کردو هەر لە گۆڕستانی هەمان ئاواییدا بە خاک سپێردرا.

عەتیە خان-یش، دوو کوڕو چوار کچی هەبووە بەم ناوانەی خوارەوە:

١- شێخ فاتیح.
٢- شێخ ڕەزا
٣- خاتوو سەبری خان
٤- خاتوو لەعلی خان
٥- خاتوو مەهابات خان
٦- خاتوو پەیمان خان

٣- سێیەم هاوسەری شاعیری خوالێخۆش بوو: (قەدریە خان)، ناوی تەواوی قەدریە خانی کچی شێخ محەمەد کوڕی شێخ محەمەد ئەمینی میرەکان بوو. ناوی دایکی مینا خانی کچی شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی بوو. ئەم بنەماڵەیە لە سەیدەکانی بەرزنجەن. لە ساڵی ١٩٢٨ لە دێی میرەکانی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی سنووری پارێزگای هەولێر هاتووەتە دنیاوە. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٩هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو زاتە کردبوو.

ئەم خوالێخۆش بووە، لە ڕۆژی ٢٠٠٨/١٢/٨ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە و بە ئامادەبوونی کەسوکارو جەماوەرێکی زۆر لە گۆڕستانی دارەتوو بە خاک سپێردرا.

قەدرییە خانیش، سێ کوڕو سێ کچی هەبووە بەم ناوانەی خوارەوە:
١- شێخ محەمەد.
٢- شێخ جەلال.
٣- شێخ جەمال
٤- زەینەبە خان.



٥- گەلاوێژ خان.
٦- شوکری خان.

وەکو ئاماژەمان بۆ کرد شێخ لەتیف لەم سێ هاوسەرە، ١٠ کچو ٨ کوری لەپاش بەجێماو ئەوەی جێی بەبیرهێنانەوەیە، لەم ١٨ براو خوشکانە دوو لە خوشکەکانیان کۆچی دواییان کردووە. ئەوانی تر تا ئەمڕۆ لە ژیاندا ماون، سەرجەم بەم براو خوشکانە. لوتفی شاعیر (١٢٨) نەوەی هەیە. (٧٤)یان کوڕو (٥٤)یش کچن.

بەڵام زۆر بەداخەوە یەکێك لە شێرە گەورەکانی نەوەکەی بە ناوی (ئەردەڵان شێخ عوبێد بەرزنجی)، ئەفسەری یاساناس (ملازمی یەك)، لە هێزەکانی ناوخۆی پۆلیسی کەرکوك بوو، لە ٢٠١١/٥/٢٠ ، بە دەستی چەپەڵی تیرۆریستان شەهید کراو چووە مێژووی کاروانی شەهیدانی کوردو کوردستان، لە پاش شەهیدبوونیشی (٤) منداڵی چاوگەشی بە ناوەکانی: ١- مەروە، ٢- محەمەد، ٣ مستەفا، ٤- مەریەم. بۆ گەلەکەی بەجێهێشت.

لوتفی بەدرێژایی تەمەنی سێ جار بووە بە مووچەخۆری میری جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٣٩ی زاینیدا لە کاتی دروستکردنی ڕێگای سەرەکی نێوان هەولێرو ڕەواندووزدا کراوە بە چاودێری کرێکاران لە ئیشغاڵ‌و ماوەیەکیش لە کۆمپانیای نەوتی باکوور کاری کردووە، بەڵام پاشان وازی لێ هێناوە. جاری سێیەمیش لە ساڵی ١٩٥٩دا بۆ ماوەی دوو ساڵ لە شاری کەرکوك کراوە بە چاودێری شارەوانی‌و جارجاریش لە گوندەکانی ساڵەییدا مەلایەتی کردووە. سەرەڕای ئەمانەش لوتفی خاوەنی مەڕو ماڵات بووە. ئارەزووی چاندنی دەغڵ دانیشی هەبووە.

هـەروەها لـە دێـی زەردک ئاسـیاو (ئـاش)ی هـەبووە وە لـەو کاتـەدا ئۆتۆمبێلی هەبووە .

لوتفی گەرچی رۆیی‌و ئەم جیهانەی بەجێهێشت، بەڵام کۆمەڵێ یادگاری زۆر خۆش‌و شیعری پڕسۆزو بەتامی لەپاش بەجێماوە هەمیشە لە یادی ئەدەب دۆستاندا بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

## لوتفی و ئەدەبیات:

لوتفی لە کاروانی ژیانی خوێندنیدا، جگە لە زمانی کوردی کە زمانی زگماکی خۆیەتی زمانەکانی عەرەبیو فارسیو تورکی زۆر بە چاکی فێر بووە. سەبارەت بە زانینی ئەو چوار زمانە، لە بواری مەیدانی رۆشنبیریدا گەلێ کاری زانیاری و ئەدەبی باشی لەدەست هاتووە، تا رادەیەکی باش خزمەتی ئەدەبی کوردی و رۆشنبیری ئیسلامی کردووە، وەك لە م کارانەی خوارەوەیدا دەردەکەوێ:

١- دیوانێکی گەورەی شیعر، کە ئەم کۆمەڵەیە وا لەبەر دەستماندایە.

٢- کتێبی (السادات البرزنجیە)ی شێخ عەبدولقادری شێخ محەمەدی لە زمانی عەرەبییەوە کردووە بە کوردی.

٣- مەولودنامەیەکی پێغەمبەر (د.خ)ی لە زمانی عەرەبییەوە بە شیعر کردووە بە کوردی.

٤- کتێبی (فتح الیمن)ی ناودار بە (رأس الغول)ی لە عەرەبییەوە کردووە بە کوردی و لەدوتوێی چوار سەد لاپەڕەوە.

٥- کتێبی (فتح ملك قطریف)ی لە عەرەبییەوە کردووە بە کوردی بە شیعر

٦- کتێبی (قصص الانبیاء)ی لە عەرەبییەوە کردووە بە زمانی کوردی.

٧- سەرگوزەشتەی چەند زانایەکی کۆکردۆتەوە و نووسیویەتەوە.



لەم بەرهەمانەشی ئەم کۆمەڵە شیعرەی نەبێ دەنا ئەوانی تری هەمووی دەسنووسن و چاوەڕوانی چاپ کردن دەکەن.

لوتفی جگە لەم بەرهەمانەی توانستێکی بەهێزیشی بووە لە شیعر لەبەرکردن، بۆیە دەتوانم بڵێم زۆربەی شیعرەکانی خۆی لەبەر بووە، لەگەڵ چەند شیعرێکی (ئیمامی عەلی) و زۆربەی شیعرەکانی (ئیمامی شافعی) و (سەعدی شیرازی) و (نالی) لەبەر بووە.

## لوتفی و پیاوە ناودارەکانی کورد :-

لە ساڵانی چلەکاندا کاتێ کە جەنابی شێخ مەحموودی نەمر لەلایەن ڕژێمی ئەو کاتەدا لە بەغدا دەستبەسەر دەبێ، لوتفی دەچێ بۆ دیدەنی لە دوای ئەوەی کە شێخی نەمر گوێی لە گفتوگۆی لوتفی دەبێ و زۆر دەچێتە دڵییەوە و ڕێزی لێدەنێ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بە زۆر لەلای خۆی گلی دەداتەوە، لە ساڵی ١٩٤١دا، کە هەراکەی ڕەشید عالی گەیلان بەرپابوو بەو هۆیەوە بارودۆخی ناوشاری بەغدا ئاڵۆز بوو بە یارمەتی چەند کوردێکی دڵسۆزەوە توانییان شێخ مەحمود دەرباز بکەن و بیگەیننەوە دێیەکەی خۆی (داری کەلی) لە پاش ماوەیەك جەنابی شێخ مەحمودی نەمر نامەیەکی تایبەتی بە پیاوێکی خۆیدا بۆ لوتفی ناردبوو تێیدا داوای چاوپێکەوتنی لوتفی کردبوو، کە ئەوسا ماڵی لە دێی (کەڵلوڕی) ناوچەی ساڵەیی بووە، (لوتفی)ش زۆر بەڕێزەوە ئەم داواکارییەی قەبووڵ دەکات و دەستبەجێ دەگاتە خزمەتی شێخی نەمر، لە دوای چوار ڕۆژ ئینجا داوای ڕوخسەت لە شێخ دەکات و ئەویش بە ئۆتۆمبێلی تایبەتی خۆی دەینێرێتەوە بۆ سلێمانیو لەوێشەوە دەگەڕێتەوە بۆ کەرکووك. لەم دوو سەفەرەدا گفتوگۆی زۆر لەنێوان جەنابی شێخ مەحمود و لوتفی دا بووە، بەڵام ئێمە لێرەدا نامانەوێ بەدرێژایی باسی لێوە بکەین.



هەروەها لوتفی زۆر بە گەرمی هاتوچۆی جەنابی سەید ئەحمەدی خانەقای کردووە و دۆستایەتی بەهێزی لەگەڵ ناوبراودا هەبووە، بەتایبەتی لەگەڵ شێخ حوسەینی کوڕی سەید ئەحمەد، چونکە هاوڕێی سەروەختی فەقییەتی بووە.

لوتفی بە هۆی کۆچی دوایی جەنابی سەید ئەحمەدەوە، کە لە ئابی ١٩٥٢دا بووە. پارچە شیعرێکی بەسۆز و جوانی هۆنیوەتەوە، کە لەناو زانایانی ئەو سەردەمەدا دەنگی داوەتەوە.

دیسانەوە لوتفی دۆستایەتی گەرمی لەگەڵ گەلێ لە ناودارانو پیاوە ئاینییەکانی عەشیرەتی شوانو شێخ بزێنیو ساڵەییو بەتایبەتی بنەماڵەی شێخەکانی ساڵەییو بەشێك لە عەشیرەتی دزەییو هەموو ساداتو ناودارەکانی بەرزنجەدا هەبووە و هەمیشە جێگەی ڕێزی هەموولایەك بووە.

لوتفی پەیوەندیو دۆستایەتی لەگەڵ زۆربەی شاعیرەکانی هاوچەرخی خۆی دابووە، لەوانە خوالێخۆشبوو (شێخ نەجمەدین) سابیری و (شێخ عەبدولخالق) ئەسیری و (جاهید)ی شاعیر لە کەرکووك زۆر دیدەنی لوتفی کردووە.

## لوتفی و شیعری کوردی:

ئێمە وەك سەرنجماندا لە ژیانی تایبەتی (لوتفی)و کاروانی ئەدەبو رۆشنبیریی بۆمان دەرکەوت، کە لەناو دەوروبەرێکی ئایینی پەروەردە بووە و بە زۆری هەر گوێی بە شیعری غەزەلو قەسیدەی ئایینی راهاتووە و لەناو جیهانی شیعری کلاسیکی کوردیدا سووڕاوەتەوە و گەلێ ئاگاداری شیعرە پڕ هونەرەکانی (نالی)و (سالم)و (کوردی)و (مەحوی)و (ئەحمەد حەمدی ساحیب قڕان)و (تاهیر بەگی جاف) بووەو لە دونیای ئەواندا ژیاوە.

شاعیرێکیش ئەوە جیهانو دەوروبەری ژیانی ئەدەبی بووبێ، هەر ئەوەی لێ ڕەچاو دەکرێ و ببێ بە شاعیرێکی کلاسیکی کورد، بەڵام لێرەدا سەرکەوتنو سەرنەکەوتنی شاعیر لە خوڵقاندنی وێنەی شیعری جوانی پڕ هونەردا دەردەکەوێ و خۆی لە کەلێنی داهێنانی ناوەڕۆکی بەهێزی هۆنراوەکانیدا دەنوێنێ.

لوتفی لە سەرەتای شاعیریەتیدا وەك عاشقێکی ئاسایی ئافرەت مامەڵەی لەگەڵ عیشقی مەجازیدا کردووە، وەك شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد، کۆمەڵە هۆنراوەیەکی دڵداری ڕێکوپێکمان پێشکەش دەکاتو هەمان وشەی فەرهەنگی شیعری ئەوان زوڵفی یارەکەی بەشەوی تاریك دەچوێنێ و روومەتی رەنگ ئاڵی بە چەرخی خڕ و گەردنی بە سوورەییای پرشنگدار و روخساری جوانی بە ئەستێرەی رابەری ڕێگەی بیابانی خۆی دەچوێنێو لەمبارەیەوە دەڵێ:



لە تاریکی شەوی زولفی لە دەستم چوو خەزینەی دڵ
بە چەرخی روومەتی ئاڵی ئەسیری چەرخی دەورانم

سورەییای گەردنی ئەوبوو چرای دڵمی کەوا کز کرد
تریشقەی تیری جادووی بوو کە خانەی سەبری روخانم

کە ئەستێرەی روخی ون بوو بزر بوو لێم هەموو رێگە
بە نەجمی روومەتی ئەو بوو دەلیلی رێی بیابانم

وە یاخود وەك شاعیرە بە دەستەڵاتەکانی تری کلاسیکیمان، یارەکەی دەکات بە زۆر دارێکی زەبر بەدەستی دڵڕفێن و نیم نیگای چاوەکانی دەکات بە تیرو نیوەی خەڵك لە ترسی زۆرداری تیری ئەو نیگایەی چاوی رادەکەنو لە دواییدا دڵەکەی دەکات بە تەیری (پەپوولە سلێمانە)ی حەزرەتی سولەیمانو بۆلای خاتوو بەڵقیسی دولبەری دەنێرێ تاکو نامە و کارتی ئەو یارە نازدارەی بۆ بێنێو دەڵێ:

دڵڕفێنە چاوەکانی نیم نیگاهی چەشنی تیر
نیوەی عالەم لە داخی زوڵمی ئەو فیراری کرد
دڵ وەکوو تەیری ( سلێمان ) لێم بزر بوو هاتەوە
کارتی بەلقیسی لەلایە هەر لەدوور هاواری کرد

لـوتفی هــەر لــە جیهــانی غــەزەلی کوردیــدا گــەلێ نموونــەی جــوانو سەرکەوتووی ترمان پێشکەش دەکاتو ئەویش وەك شاعیرەکانی پێش خۆی یارە دڵدارەکەی دەکاتە خاوەن زەبر و زەنگو حوکمڕانو تیغی ئەبرۆی دەکات بە هۆی نەهێشتنی خۆراك و خەویو بە سەد پزیشکی پسپۆر دەرمانی دڵە زامدارەکەی بۆ ناکرێ، بەڵام بە یەك دیدەنی ئەو یارەی هەموو زامو برینی جەرگو ناوەکەی تیمار دەکرێ هەروەك دەڵێ:

چاوەکانت بۆتە باعیسی ئەشکی ڕوونی چاوەکەم
تیغی ئەبرۆت باعیسە بۆ مەنعی خوردو خاوەکەم
سەد وەکوو ( لوقمان ) کە بێتو کوا دەکا دەرمانی دڵ
دیدەنی ئەو کافییە بۆ زامی جەرگو ناوەکەم

دیسان هەر لە بواری و مەیدانی شیعری دڵدارییەوە لوتفی داهێنانێکی نوێو وەدەست دێنێ، کە شاعیرە کۆنەکان وەدەستیان نەهێناوە، خوڵقاندنە نوێیەکەشی خۆی لەو وێنە شیعرییەدا دەردەخات، کە بە هۆی چەند وتەیەکی شیرینی یارە نازەنینەکەی، دڵی وەکو کنێری ناو شاخانو گوڵی باخان دەگەشێتەوە و دەگەڕێتەوە سەردەمی لاوێتیو دەڵێ:



بۆ کاتی لاوی دڵ گەڕایەوە
وەکوو کنێرە گوڵ گەشایەوە
چونکە ڕووبەڕووی یاری نازەنین
وەك گوڵی خونچە دەم بە پێکەنین
بە نوکتە کەوتە گفتوگۆو کەلام
شەکەر شکاندن نەغمەی وا بەتام

لوتفی لە گۆشەی شیعری عیشقی مەجازییەوە وردە وردە خۆی دەخزێنێتە ناو دونیای هەستی دەروونو دەردی دڵ دەربڕینو وەسفێکی زۆر ورد و ناسکی باری دڵو دەروونی خۆی دەکاتو چەند وێنەیەکی شیعریی جوانمان دەخاتە بەردەستو دەتوانم بڵێم لە شیعرە هەرە سەرکەوتووکانیەتی، چونکە بەسەرهاتو تاقیکردنەوەی تایبەتی ژیانی خۆیەتی لە مێشكو دەروونیدا پەنگی خواردووەتەوە، وەك شیعرێکی ناسك ڕشتویەتیە سەر ڕووی لاپەڕەی دیوانی شیعرەکانی هەروەك لەم هۆنراوەیەیدا دەڵێ:

ڕەنگی زەرد و ئەشکی چاوم دەردەکەم زۆر کارییە
هەروەکوو سیروان لە چاوم سەیلی ئەشکم جارییە
زانین و عەقل و کیتابەت سوودێکی بۆ من نەبوو
ڕەنجەکەم گشت چوو بەبادا بەختەکەم هەرخوارییە
باخەوانی باغی گوڵ بووم سەردەمێ خۆش ڕامبوارد
ماوەیەکی کورت و کەم بوو داخەکەم یەکجارییە

لوتفی له زۆر شوێنی تری هۆنراوەکانیدا گەلێ ڕاستگۆیانه له دەردی دەروونی خۆیەوە کە لەم جیهانەدا بە ئاواتەوە بووە خودا لەم دونیایەدا تەنها یەك سەعات شادی و خۆشی پێ بدات، چونکە وەك لەمەوبەر گوتمان هەمیشە بەدەستکورتی ژیاوە و ژیانێکی هەژارانەی بەسەر بردووە، هەروەك لەم دێڕە شیعرەیدا ئەم هیواو ئاواتەی دڵی خۆی دەردەبڕێو دەڵێ:

چەندم ئاواتە ئەگەر سەعاتێ
خودا لە دونیا شادیم بداتێ
هیچ فایدەی نییە دایم لەغەمدام
دایم بێهۆشو سەرسامو شەیدام

یاخود لەو کاتەی کە ئامۆژگاری خەڵکەکە دەکاتو پێیان ڕادەگەیەنێ خۆشیو شادی بۆ ئادەمیزاد تاسەر نابێو خۆشی بوهاری شادومانی گەرمای بەجۆشی هاوینی بەدواوەیە و دەوڵەمەندیش هەژاریو نەبوونی بەرانبەرە، بۆیە پێویستە مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا زۆر ئاگاداری خۆشیو ناخۆشیو هەبوونیو نەبوونی خۆی بێ هەروەکو لە هۆنراوەکەیدا دەڵێ:

مەڵێ بوهارە دونیا زۆر خۆشە
هاوین لە دوایە یەگجار بەجۆشە
مەڵێ من هەمە ڕوتبەی ئەمیری
بەرانبەرێتی دەردی فەقیری



لوتفی هەر لە گۆشەی دەروونییەوە دەچێتە ناو دونیای خودا پەرستیو پەشیمان بوونەوە لە کارو کردەوەکانی پێشووی خۆیو دەست لە عیشقی مەجازیی ئادەمیزاد هەڵدەگرێو ڕوو دەکاتە عیشقی حەقیقی، عیشقی خودایی و ڕوو دەکاتە دەرگای پێغەمبەری خۆشەویستی خودا و خۆشەویستی خۆی تاکو لە تەنگانەدا بە هانای بێو لە ناخۆشیدا ڕزگاری بکاتو لە گوناهەکانی خۆش بێو دەڵێ:

ئەی ئەسیری تەوقو قەیدی نەفسی بەد ئەممارە خۆم
بێ کەسو بێ موونسو بێ هەمدەمو غەمخوارە خۆم
ڕامبوارد عومری عەزیزم گشت لەکاری ناشیرین
ڕوو سیاو شەرمەزارو سەرکزو پەتیارە خۆم
ڕۆژو شەو ناڵەی دەروونم خەڵکی بێزارکردووە
یا ڕەسوڵەڵڵا دەخیلەك ڕوو ڕەشو بێ چارە خۆم

شاعیری خودا پەرستمان زۆر بە دڵپاکیو دڵسۆزی بۆ خودای تاكو تەنیای، ڕەفتار دەکاتو لۆمەی چاوەکانی خۆی دەکات، چونکە سەردەمێك تەماشای ڕەنگو ڕوخساری دولبەرەکەی پێ کردووە و پێی دەڵێ:
ئەوا دوایی تەمەنی ژیانتەو، یادی بەزمی عاشقان لەبیر خۆت ببەوە و ڕووت لە دەرگانەی خودای گەورە بکە و هەر زیکری ئەوت لەسەر زمان بێ و دەڵێ:

ئەی چاو بەتوو چی روخساری دولبەر
دوایی عومرتە هەی خاکت بەسەر
بە توو چی شادی بەزمی دڵداران
بەتووچی سەیری باخ و گوڵزاران
لە یادت دەرکە بەزمی عاشقان
ئەمجا وەرە سەر زیکری یا رەحمان

لە دوایی ئەم سەرەتایەدا (لوتفی) دوای باسی خەرمانی تەمەنی بابردووی دێتە سەر عیشقە حەقیقیەکەی بۆ خودای پەروەردگاریو داوا لە دڵەکەی خۆی دەکات واز لە خۆشەویستیو عیشقی سەر دونیا بێنێو لە جیاتی ئەمانە با هەر ناوی خودای گەورە بێنێ، هەروەك دەڵێ:

خەرمانی عومرت مەعلووم با بردی
ئەم چەرخە چی ویست ئەوا پێی کردی
رۆژو شەو دایم زیکری خودا کە
تەرکی زینەت و حوبی دونیا کە

لوتفی وەنەبێ هەر لە بازنە و چێوەی غەزەلو، هەستی دەروونو خوداپەرستییەوە بەهرەی شیعری سەری هەڵدابێ، بەڵکو وەکو شاعیرێکی نیشتمانپەروەر و، دڵسۆزێکی نەتەوەی کورد، هاتووەتە مەیدانی شیعری نەتەوەییو گەلێ نموونەی جوان جوانی لە شیعری کوردایەتیو وەسفی کوردستان داناوە.



هەروەکو لەم چەند نموونانەی خوارەوەیدا بۆمان دەردەکەوێو با بزانین لەم چوارینەیەدا چۆن داوای راپەڕینی میللەتەکەی دەکات لەم سەردەمو رۆژگاری ئازادیو رزگاری گەلانی جیهاندا و دەڵێ:

دەسا غیرەتێ ئەی میللەتی کورد
ئەستێرەی بەختت وا تلووعی کرد
ئەمرۆیە رۆژی ئازادی گەلان
را پەڕە وەك مەرد ئەتۆش دەستوبرد

هەر لە بواری شیعری کوردایەتییەوە شاعیرمان لەبارەی ژیانی نەتەوەکەیەوە دەدوێ بەڵام نەك وەکو شاعیرێکی نوێخوازی ئەم سەردەمەمان، بەڵکو هەروەکو شاعیرە کلاسیکییەکانی پێشوومان تەنیا دەردی گیروگرفتی میللەتەکەی دەردەخات، بەبێ ئەوەی چارەو، دەرمانێكو رێگەی رزگاربوونی لەو دەردانە بۆ دەستنیشان بکاتو ئامۆژگاری رۆڵەکانی نەتەوەکەی بکات، تا پەیڕەوی بکەنو گیروگرفتەکانی چارەسەر بکەن هەروەك لەم چوارینەیدا دەڵێ:

هەر چەن سەیرەکەم حاڵم شیواوە
بۆ میللەتی کورد ئەژنۆم شکاوە
وەك ئاسکی غەریب لە دەشتێکی چۆڵ
رەشە راوچییەکان دەوریان داوە

لوتفی هەر لە بواری کوردپەروەریەکەیەوە، دەکەوێتە وەسفی کوردستانو دەیکات بە بینایی چاویو بە دڵو بە گیانیو بە هۆی گورجو گۆڵی بەسەرچاوەی ژیانیو بەم جۆرەی لای خوارەوە ئەم وەسفەمان لەم چوارینەیەدا بۆ دەردەبڕێو دەڵێ:

**کوردستانەکەم نیشتمانی من**
**بینای چاوانم دڵ و گیانی من**
**سەیری دیمەنی رەنگاورەنگی تۆ**
**هۆی نەشاتمەو هەم زمانی من**

شاعیر ناچێ وەکو هەندێ شاعیرەکانی پێشووتر ئافرەت لە مەیدانی ژیاندا لە پیاو دابڕێو بیخاتە ژێر پەردەی نادیاریی، بەڵکو لەلای شاعیر، ئافرەت مایەی شانازی پێوەکردنو سەربەرزی میللەتی کورد بووە، چونکە ئافرەتانیش شانبەشانی پیاوەکان دێنە مەیدانی چالاکی نواندنی کۆمەڵایەتیو ئابووری وقارەمانێتی نواندن، هەروەك لەم چوارینەیەدا دەڵێ:

**لەبەرکە خانمی کورد بەرگی کوردی**
**بەلەنجەو لارو نازو سەر بڵندی**
**چ چالاك و دلێرو خانو مانی**
**بە ناوبانگی لە عالەمدا بە مەردی**



زۆر لە رەخنەگرانی ئەدەب دەڵێن، هونەری شاعیرو بەهرەی شیعریو خوڵقاندن لە وەسفکردندا سەر هەڵدەدەنو وەسفی سەرچاوەی هەموو وێنەیەکی شیعری شاعیری لێهاتووە، بۆیە تا شاعیر وەسفەکانی وردتر و ناسکتربێ، لە بوار و چێوەی شیعرو هۆنینەوەدا سەرکەوتووتر دەبێ. جا لێرەدا دەبینین (لوتفی)ی شاعیر هونەرەکەی لە وەسفی خاکی نیشتمانەکەیدا لە وەرزی بوهاراندا دەردەکەوێ، بۆیە دەبینین زۆر بە وردی وەسفی دەشتو دەرو گوڵو گوڵزارو خونچەو بولبول و یارەکەی دەکات ئەمانەش خۆیان لەخۆیاندا وشەی شیعری ناسكو هەوێنی هۆنراوەی جوانو بەرزن هەروەك لەم چوارینەیەدا دەڵێ:

**گیانە وەرە دەشت ئەوا بوهارە**
**وەعدەی سەیرانی گوڵ و گوڵزارە**
**خونچە بەشەوقە بولبول لە زارە**
**وەختی دیدەنی یاری دڵدارە**

لە دوای ئەم چوارینەیەیدا، دەکەوێتە باسی رازانەوەی سروشتی دەشتودەری نیشتمانەکەیو شادیی مەل و باڵندەکانو سەر دەرهێنانی گوڵو رەیحان، کەچی هێشتا دڵی خۆی هەر زامداری خەمو تاڵی ژیانی گەلەکەیەتی، هەروەك لەم چوارینەیدا دەڵێ:

**دونیا خەملیوە بە گوڵی زەردو شین**
**مەلان بەشادی دەم بە پێکەنین**
**سەریان دەرهێنا رەیحانو نەسرین**
**ئیمڕۆ دڵەی من بۆچی زامارە**

شاعیری هونەرمەندمان هەر لەسەر وەسفی رازانەوەی دەشتودەری خاکەکەی دەڕواتو ئەوەمان بۆ دەردەبڕێ، کە چۆن (با) یاریی بە باڵای عەرعەر دەکاتو هەموو شتێك تاجی وەرزی نوێی بوهار لەسەر دەنێ ئەو هەموو رازاندنەوە و خۆشیو شادییە بۆچییە و لەبەر چی؟ هەمووی لە خۆشی بوهاری رەنگینە هەروەك دەڵێ:

فەرشی رەنگینی پۆشی دەشتو دەر
با یاری دەکا بە باڵای عەرعەر
تاجی بوهاری گشتی نایە سەر سەر
هەمووی لە خۆشی جوانی بوهارە

خوێنەری بەڕێز... ئەمە بوو پێشەکییەکی کورتی دیوانە رەنگینەکەی شاعیری کورد (لوتفی) ویستمان بەر لە خوێندنەوەی شیعرەکانی شتێك لەبارەی ژیانی شاعیرو دەوروبەری سەرهەڵدانو پەروەردە بوونیو شاعیرێتی بزانی، بۆت روونبێتەوە لە دەرگای چەند هونەری شیعری کوردی داوە؟ یاخود لە چەند جۆرو مەبەستو بواردا خۆی لە زێی ئەدەبی کوردی داوەو تا چ رادەیەك سەرکەوتووانە لێیان پەڕیوەتەوە، ئینجا ئێستاش با پێکەوە بگەینە سەر خوێندنەوەی هۆنراوەکانی ئەم دیوانە رەنگینە.

شێخ
عەبدوڵلا شێخ بابەعەلی بەرزنجی
هەولێر: ١٩٨٣/١٠/١٥



**تێبینی :**

لەگەڵ ئەم چاپەدا کە چاپی سێیەمە، بە ئاگاداری بەڕێز شێخ عەبدوڵڵا بابەعەلی، کە پێشەکییەکەی لە ساڵی ١٩٨٣دا نووسیوە بە باشمان زانی هەندێ گۆڕانکاری لەم چاپەی سێیەم دا بکەین و زانیاری زیاتر بخەینە ڕوو.

٢٠١٢/١٢/١٢



**بەشێك لە بنەماڵەی لوتفی لە چلەكەیدا لە ١٩٨٩/٦/٧**

# {بەشی ئایینی}



وێنەی لوتفی شاعیر لە ١٩٨٥/١١/١

لە تەکییەکەی خۆیدا



## وای پەشیمانم

وای پەشیمانم لە داخی کـــردەوەی نەحس‌و خراپ
دڵ ئەناڵێنیٚ لە ترســـــا هەروەکوو جەنگ‌و روباب
جیســـم‌و جانم تێك شـــکاوە تاقەت‌و شەوقم نەما[1]
روو لـــە ئاخیر وا ئـــەڕۆم‌و نزیـــکە ڕۆژی حیســـاب
مـــەزرەعەی گونـــاهی من حـــەدو حیسابی قەت نییە
کـــاکـــە چی بکـــەم لـــە تاوی مەحشەرو ڕۆژی عەزاب
هەڵســـــە زووبە تاکووو ماوە پێنج‌و دوو ڕۆژی عومر
تەوبەییٚ راســـتی بکەو هەم رووکـەرە دەرگەی سەواب
پشـــــت لە دونیاکە هەژار تازە بە تووچی موڵك‌و ماڵ
پـــارەیێکی بـۆ نـــەکرد ئەســـکەندەرو ئەفراســـیاب
چۆن بـــەبیٚ باکی‌و سەفاهەت راتبـوارد عومری عەزیز
تازە ڕۆیی چـــوو لە دەستت عومری گەنجی و شەباب
(لوتفی) تەقواکە بەراستی کونجی خەڵوەت بگرە دەس
بەڵکوو شـــافیع بیٚ لـــە بۆ تۆو ســـەیدی عالی جەنـــاب

*　　　*　　　*

[1] لە چاپی یەکەمدا نووسراوە: تاقەتی وا لیٚ برا، لە دەستنووسێکی بەم شێوەیە نووسراوە.

## تیری ئەبرۆی(١)

تیری ئەبرۆی وا لە ناوی جەرگو دڵدا کاری کرد
هەروەکوو دوژمن لە من دەستی وەشانو غاری کرد
رووی لە ماڵی غەیرە کردو بێ خەبەر لە حاڵی من
شووشەی دڵمی بە جارێ تووشی بە سەنگ وخاری کرد
ساغو بێ عیللەت بە خۆم بووم وەك تەبیبی حاڵزان([2])
زەرەیێ رووی خۆی نیشاندام بە وەرەم دوو چاری کرد
دڵ رفێنە چاوەکانی نیم نیگاهی چەشنی تیر
نیوەی عالەم لە داخی زوڵمی ئەو فیراری کرد
شەوقی روخساری بە دەرکەوتو رووناك بوو مولکی دڵ
پارچەیی هەوری غەزەب هاتو بەسەر پێواری کرد
دڵ وەکوو تەیری (سولەیمان) لێم بزر بوو هاتەوە
کارتی بەڵقیسی لەلایە هەر لە دوور هاواری کرد
چی ئەکەی (لوتفی) ئەوا چووو تۆی بەجێهێشتو ئەسەف
وەك کەوی وەحشی بە جارێ عەزمی سەرچناری کرد

*　　　*　　　*

---

[1] نهم شیعرە لە گۆڤاری نێرگز ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٨٥ بڵاوکراوەتەوە و کراوە بە پێنج خشتەکی لەلایەن مامۆستا جاهیدەوە.

[2] لە چاپی یەکەم لە جیاتی حاڵیزان بە هەڵە خائینان نووسراوە.



## ئەی چاو برێژە

ئەی چاو برێژە ئەشکی خەفەت بار
فرمێسکت بابێ وەك سەیلی بوهار
قافڵەی رەفیقان هەردەم بەڕێوەن
لە بەڕو بەحر لە دەشتو لە شار
هەرگیز ناوەستێ وەخت بێ وەخت
نۆبەی هات ئەڕوات بێ خەمو خەمبار
هەر چەن ئیشو کار خەیاڵی زۆر بێ
ئەبێ جێی بێڵی کەس نایبێ رزگار
هیچ مۆڵەت نییە هەر چەن رجاکەی
لێم گەڕێ ماوە تۆزێ ئیشو کار
شووشەی عومرەکەت وا بە دەستەوە
شەقەی لێی هەڵسان دای لەسەنگی خار
(لوتفی) بزانە زۆرت نەماوە
روو لە خوداکە هەر بڵێی هاوار

*　　　*　　　*

## ئیلاهی هەر تووی (١)

ئیلاهی هـــەر تۆی فەردی فریــاد رەس
هەرتۆی بۆ بێکەس‌و پشت‌وپەناو کەس
هەر خۆت شـــارەزای لە حاڵی ئینســـان
لە ئەوەڵ عومـــری تـــا ئـــاخیـر نەفەس
خـــودایە شــەکـوام بگــاتــە دەرگـــات
یەکجار پەشـــێوم بێ شـــەوق‌و هەوەس
رۆژو شـــەو پیشـــەم شــــین‌و گـریـانە
دایم مەحـــزوونم وەك تەیری قـــەفـــەس
لـــەو رۆژەی بـــوومـــە تاکـــوو ئـــەم کاتەم
هیچ خۆشـیم نەدی غەیرەز دەردو بەس
دائیم لارە خوار بێ جێی‌و ســەر گەردان
ناڵـــەی دەروونـــم وەك دەنگی جـــەرەس
ئـــەرۆم بـــەڕێـــوە ئـــەژنـــۆم ئـــەلـــەرزێ
جـــەرگ‌و هەنـــــاوم بووە بە قەقـــنەس
خودا بۆ خاتـــر ســـیی جزمەی قورئان
ئـــەو عـــومـــرەی مـــاوە نەڕوا بە عەبەس
(لـــوتـــفـــی) بە تاعـــەت بشۆ ژەنگی دڵ
رۆژ وشـــەو رووکـــە بـــارەگای ئەقدەس

[1] ئەم پارچە شیعرە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.



## یا رەسووڵەڵڵا دەخیلە

یا رەســـووڵـــەڵـــڵا دەخیلـــەك ماڵی وێران بێ منم
چاو بە ئەشك و دڵ بە ئاهو غەرقی عوسیان بێ منم
روو رەشی دونیا و قیـامـــەت تویشـــەی راهم نییە
نا ئومێدی کردەوەی خۆم رەنج بە خەسران بێ منم
دەردەکـــەم دەردی گـــرانە زۆر لـــە مێژە تووش بووم
ئەوکەسەی دووچاری دەردو دووری دەرمان بێ منم
بۆچ نـــەگـــرێم مـــن بـــە دایـــم شـــیوەنێ بـــەرپا نەکەم
دووکـــەڵی ئاهی دەروونم روو لـــە ئاســـمان بێ منم
سەد پەشـــیمانی‌و نەدامەت وا لە ناو دڵ هەڵئەسێ
یا رەســـووڵـــەڵـــڵا دەخیلەك خاك بە دامان بێ منم
بارەکـــــەم یەکجـــار گـــرانە کـــەس نییە دەس باریدا
دەستی ناو کەشتی بە دەرخە غەرقی تۆفان بێ منم
خۆتی چارەی دەردی (لوتفی) یا شەفیعول موزنبین
بێ نـــەواوو بـــێ عیـــلاجی و چـــاو بە گریان بێ منم

*   *   *

## لایەقی زوڵم و جەفا خۆم (١)

لایـــەقی زوڵـــم جـەفـا خـــۆم، غـــەرقی دەریـــای خـەتا خۆم
مـــائیلی ئەهلی فـــەنا خۆم، تـــالیبی زوومـــرەی شەقا خۆم
دەستە ئەژنۆو قوڕ بەسەر خۆم، ماڵوێران و ڕەنج خەسار خۆم
عومری گەنجی بێ سـەمەر خۆم، ڕوو ڕەشی دارول بەقا خۆم
چیـم نـەکـرد من بـۆ قیـامـەت، کـەوتـمـە ئـاهو نـەدامەت
چاوو بە ئاوو دڵ بە حەسـرەت، ژینی بێ سـوودو هەبا خۆم
عومـــرەکـــەم چـــوو بە تـــاڵان، مەحکوومی نەفسو شـەیتان
مائیل بە ئەهـــلی عوســـــیان، ڕوو زەرد ڕۆژی جـەزا خـۆم
ڕۆژی جــــەزا مەســــئوولــــم، بۆیـــە ئــەوەند مەلــــوولــم
کــردەوەی بــێ مـــیــوولـــــم، مل لـــە داوی بـــەڵا خـــۆم
ئـــەســـیری داوی بـــەڵام، تـــالـیــبی نەفـــس و هـــەوام
زۆر ڕووش و بێ حـەیــام، ڕوو لـــە ئـــەهلی فـــەنـا خـــۆم
(لـوتـفـی) دوور لە تـەقـوا بوو، عـاسـی لـە ئەمری خوا بوو
لــە مەغـــرووری ئەغـــوا بـــوو، ســـاعـی بۆ پێشـــەوا خـــۆم

* * *

(١) ئەم پارچە شیعرە سێ بەیتی یەکەمی شانزە برگەییە، بەڵام چوار بەیتی دوایی چوارده برگەییە.



## وای کە ڕوو زەردو زەلیل

وای کـــە ڕوو زەردو زەلیـــل و ماڵ وێران بـــەدحـــاڵە خۆم
بێ ســـەمەر عـــومری عـــەزیزی تەڵخی ترش و تاڵە خۆم
دایما هـــەروەك ســـەماوەر جۆش ئەخـــوا دڵی حـــەزین
بۆ هـــەنـــاوی زۆر ســـوتـــاوی ئاگـــرو زووخـــاله خـــۆم
ســـەیلی ئـــەشـــکم هـــاتـــە خـــواریّ تێکی دا بینای دڵ
هێـــرشـــی مـــردن کـــە هـــات و من لـەســـەر کەنداڵە خۆم
گـــەرچی ئـــەوەڵ حـــورمەت و ئیقبالێـــکی چاکم هەبوو
عـــاقیبەت ڕووت و قەلـــەندەر بێ کەس و عـــەبـــداڵە خۆم
مـــوودەتێ مانـــەندی قـــومری نەشـــئەو شـــەوقم هەبوو
گـــەرچی ئیمرۆ لارە خـــوارو عەینی هـــەروەك داڵـــە خۆم
خاوەنی نووتـق و زەکابووم دەنگی خۆش و چاوی گەش
ئیمـــرۆ ئەمبینی کـــە کـــوێرو کـــەڕو گێژو لاڵـــە خـــۆم
حاصڵی گشت جەستەکەم پڕ دەردەسەر تاکوو قەدەم[١]
چی بەیان کەم زۆر پەرێشـــانم لە نـــاو ئـــەم چاڵە خۆم
بە ســـەفاهەت ڕاتبوارد عـــومری عـــەزیزت ئەی هەژار
هەر بڵێی وا حەســـرەتا داماوی ڕۆژ ســـوئاله خـــۆم
چی ئەکەی (لـوتـفی) لەتەگبیر هاتە پێش حوکمی جەزا
چـــارەیێ بۆ خـــۆت بـــدۆزە تـــەوبەیێ لـــەم حـــاڵە خۆم

[١] ئەم دێڕە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.

## روو رەشی دەرگاهی تۆم(١)

یا رەســـوڵـــەڵـــلا دەخیلە روو رەشی نامە ســـیـــام
غـــەیری توو هیچ کەس نییە بۆ من ببیٚ پشتو پەنام
روو رەشی دەرگـــــاهی تۆم هاتوومـە بەر دەرگانەکەت
عاجزو ریســـــوای گوناهم خاکەســـــاری رووی جەزام
زۆر پەشـــــیمانم ئەگـــەرچی پـــارە ناکـــا دادو شین
عومــــری گـــەنجیم رابوارد گشتی بەبیٚ هۆشیو نەفام
تازە چی بکەم روو لەکویٚ کەم کیٚ بەیادکەم غەیری تۆ
چاوەڕیٚی لوتفت ئەکەم، وەســـتاومە هەروەك خەدام([2])
ســـەری خۆم هـــەڵگـــرتو هـــاتم بۆ دەخـــاڵەت بۆ رجا
ملکەچو روو زەردو مەئیوســـم ئەتووی خەیرول ئەنام
تەرکی فەرزو ســـــوونەتم زۆرە چ فایدە چوو لە دەس
خۆم بە نەســـڵی تۆ ئـــەزانم ئـــەی حـــەبیبی لایـــەنام
(لـــوتـــفـــی) دەردی زۆر گرانە ئەی شەفیعول موزنبین
رووی لوتفت ســـا نیشـــاندە زۆر زەلـــیلو بیٚ نەوام

[1] لە ساڵی ١٩٦٧ی زایینی کاتیٚ کە چووە بۆ مەدینەی منەوەرە بۆ تەوافی کەعبەی پیرۆز لە خزمەت پیٚغەمبەردا درودی خودای لیٚ بیٚ ئەم غەزەلەی بەو هۆیەوە لەو سەفەرەدا وتووە.
٢ لە شوێنێکی تر بەم شێوەیە نووسراوە:
چاوەڕیٚی لوتفت ئەکەم ئەی خاوەنی روتبەو مەقام.



## گەر ئەبیسن دەنگی گریان

ئەو کەسەی مەحکوومی دەستی نەفسو شەیتان بیٚ منم
فاســـقو عـــاســـی لـــە ئومـــەت شاهی جیهان بیٚ منم
رامبوارد عومری شـــەبـــابیم بـــە هـــەوای نەفسی دەنی
دڵ بـــە داخو مـــاڵ ویٚـــرانی رۆژی مـــەیـــدان بیٚ منم
بیٚ موعینو دەســـــتگیـــرو بـــیٚ رەفـــیـــق بـــیٚ عـــەمەل
تووشـــی ســـــەحـــرای عـــەدەم چۆڵو بیابان بیٚ منم
کـــەوتنـــە ریٚگـــەی حـــەقو ریٚگەی سەلامەت خزمەکان
تەوبـــە بیٚ یارەب ئـــەوەی هەر کوڵ بە عوسیان بیٚ منم
با لـــە لایـــان ئاشـــکرابیٚ عالـــەمی ســـەر رووی زەمین
با بـــزانـــن زیـــاد لـــە خـــەڵکی ئەهـــلی نیران بیٚ منم
گـــەر ئەبیســـن دەنگی گـــریان وەختی شـــەو نیوەشەو
ئـــەو کەســـەی بۆ حاڵی قەبری زۆر پەریٚشـــان بیٚ منم
موســـتەحـــەقە ژەنگی دڵ بۆ قـــەترەی رەحمەت خودا
رۆژو شـــەو هـــەر چـــاوەڕوانی رەحمی یەزدان بیٚ منم
رووم نییە هـــەرگـــیـــز بڵیٚـــم من نەسڵی ئەو پیٚغەمبەرەم
دوور لـــە باســـی شـــەرعو عیـــلمو دینو ئیمان بیٚ منم
مەیلی نەفســـم حـــازرە هـــەر دایمـــە بـــۆ لای گـــوناە

یا رەسـوڵـەڵـلا دەخیـلە دەس بـە دامـان بیّ منم
خاكو خۆڵكەم جا بەسـەردا سـەر لە بۆ كویّ هەڵگرم
لایـەقی گـریـانو شـینو دادو ئـەفـغـان بیّ منم
(لـوتـفـی) بـۆچی وا زویـری دڵ بـدە رەحمی خودا
هـەر بڵیّ هـەردەم ئـومیّـدی عەفوی رەحمان بیّ منم

*　　　*　　　*



## ئەی برادەر چی بكەم

ئـەی برادەر چی بكـەم دڵم پڕ بـووە لە غـەم
شـادی لە دڵدا نییە گەر ئەپـرسـی زۆرو كـەم
خەیـاڵی فیكـری دونیـا دڵ ئەفـڕیّ لـە هـەوا
فكری ئاخیرەت بە جـاریّ چووەتە دەرەجەی عـەدەم
عەجـەب عـەقڵو شـعوورت لـەلا نەماوە كاكـە
قەت فكریّ ناكەی ئەتوو لەئەمری خودای ئەعـزەم
بەسـە تۆ بیری بكە ئـەی روو رەشی رووسـیاه
چەندی مەغـروورو بیّهۆش ناترسی لە جەهـەنەم
حـەیاكە لەو خـودایە بیّ هاوتاو بیّ شـەریكـە
خالقی ئەرزو ئاسـمان بە هەشتو باخی ئیرەم
تـەوبـەكـە زوو فرسـەتە ئـەجـەل دایم حازرە
لە بن گویّ هەموومـانە بـە زوجـەلالی قەسـەم
(لـوتـفی) تۆ دەخالـەت كە بە دەرگاهی ئەو كەسە
كە خۆی خەیروننەبییە ئوممەتی خەیـرول ئوممە

*　　　*　　　*

## ئەی ئەسیری تەوق و قەیدی

ئەی ئەسیری تەوق و قەیدی نەفسی بەد ئەمماره خۆم
بێکەس و بێ موونس و بێ هەمدەم و خەمخواره خۆم
دوور له خزمان و وەتەن مولْکی عەشیرەت کەوتووم
ساکنی مولْکی غەریبی بێ کەس و ئاواره خۆم
رامبوارد عومری عەزیزم گشت له کاری ناشیرین
رووسیاهو شەرمەزارو سەرکزو پەتیاره خۆم
دڵ وەکوو راوچی له دوای مامزی حیرس و تەمەع
رۆژو شەو هەڵپەو بلۆق دونیای عەززاره خۆم
کەوته پێشم رێگەی دوور بێ تەدارەك بێ ئەساس
بێ وڵاخ و بێ زەخیرەو زادو پوول و پاره خۆم
قەت نەکەوتە فیکری من رۆژی که تۆ ئەمری و ئەڕۆی
وای که بێ عەقڵ و شعوورو بێ نەواو عاره خۆم
بێ ئەمەل رۆیم له دونیا رەنج خەسارو دەس به تاڵ
کردەوەی چاکەم نەکرد وای له خۆم هەژاره خۆم
کەوته پێشم رێی بیابان تەهلوکەی بێ زادو ئاو



وای غەریبی دەشتی مەحشەر بێکەس و بێ یاره خۆم
سواری ئەسپی جەهل بوومە روو لەشاخ و دەشت ئەکا
بێ لغاوو زین و رەشمە بێ دەس و هەوساره خۆم
پێی شەل و قۆناخی دوور سەر جسری سیراتم ئەمن
کۆتەرەی نیوه سووتی قەعرەی جەحیم و ناره خۆم
تای تەرازووی لای گوناهم زۆر گرانه ئەی ئەسەف
روو رەش و ریسوا لەبەر دەس سەیدول ئەبراره خۆم
دەس به زنجیرو عەزاب گیرۆدەی دەستی مەلەك
رام ئەکێشن بۆ جەهەننەم ئەوجا زەهری ماره خۆم
دەستی یەئسم دانەناوه گەرچی ترسم زۆر هەیه
بۆ تەمای حۆری و به هەشت و میوەو گوڵزاره خۆم
چونکه (نەصی) داوه حەق دەرحەق بەئەهلی تائیبان
تەوبەبێ یاڕەب تەمەننای تەوبەی یەکجاره خۆم
قەترەیێ رەحمەت بڕێژه دەرحەق بەندەی هەژار
بیکەیه باعیس رووناکی ئەم دڵەی ژەنگداره خۆم
رۆژو شەو ناڵەی دەروونم خەڵکی بێزارکردووه
یا رەسووڵەڵڵا دەخیله روو رەش و بێ چاره خۆم
(لوتفی)غەرقی بەحری عوسیان تابەکەی کردەی نەفام
دەس بەر کەشتی نەجات و هەر بڵێی هاوار خۆم

*    *    *

## ئەی دڵ بێزاری لە ژین

ئەی دڵ بێزاری لە ژین،هەموو دەم مەشغولی شین
بەسیە تاکەی هەر گرین، جاریٚ ئاو جاریٚکی خوێن
دڵ بریندار ی زەمانم، خەرمەنی عومری سووتانم
دەربەدەر تاڵە ژیانم، جەرگ و دڵ بۆتە برین
وەکو خوێن ئاوی چاوم، خۆم وەکو کەشتی سەرئاوم
تابو تاقەت لێ براوم، مردنم چاتر لە ژین
چاترە مەرگ لەم ژیانە بوومە جێی تانەی بێگانە
وام لە زومرەی فاسقانە، روسیای بەر دەستی دین
شەرمەزاری لای رەسوولم، بۆیە غەمگین و مەلوولم
لە کردەی خۆم ناقەبوولم، سەد دەخیل شای مورسەلین
شاهی جەمعی ئەنبیایی، خۆشەویستی زاتی خوایی
شافیعی رۆژی جەزایی، هاوارە شاهی مەدین
هەرتوو شاهی ئینس و جانی، خاتەمی پێغەمبەران
جێی مورادی عاسیانی، خەلقەتت ئایەی موبین
مەدحی تۆ ئایەتی قورئان،خاوەنی موعجیزەو بورهان([1])
ئەی ئەشرەفی هەردوو جیهان، خۆتی رووناکی سەر زەمین
ناوی توو یاسین و تاهە، بۆ ئوممەت پشت و پەناهە
(لوتفی) کە خاوەن گوناهە، تووی شەفیعول موزنبین

[1] ئەم تاکە دێڕە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.



## ئەم دوو کەسە عالیمن(١)

ئیمرۆ لەگەڵ چەن کەسیٚ چووبووینە (ئالی بەیان)([2])
بۆ تەعزێی محەمەد ئەمین و دیدەنی خزمەکان
وەختی چووین و دابەزین کۆبووینەوە چەن عەشرەت
عالەم گشت کۆمەڵ بوو بوو دەرو ژوورو دیوەخان
وەکوو هێلانەی مێش هەنگ بە یەکدا دەهات زەلام
کەس ئاگای لە کەس نەما وەك رۆژی ئاخر زەمان
عالیمان دانیشتبوون لەگەڵ کوێخاو ئاغاکان
حەدیسیان دەخوێندەوە لە بارەی دین و قورئان
بەڵام نووتقی دوو کەسیان غایەتەن بە نەشئەبوو
یەکیٚ مەلای (قوولی بەگ)([3]) ئەوی دی (مەلای کیژان)([4])
قورئانێکی دانابوو مەلا کیژان کە ئەی خوێند
دەستووری شاری کەرکوك ئەی خوێنن لەسەر قەبران
ئەو رۆژە زانیوومە من ئەم دوو کەسە عالیمن

[1] ئەم پارچە شیعرەی بە هۆی پرسەی دۆستێکی محەمەد ئەمین ناوی خۆیەوە وەتووە.لە ساڵی ١٩٤٦دا بووە وەکو خەلیفە عوبێدی کوڕی خوا لێخۆش بوو پێی راگەیاندم.
٢ ئالی بەیان، گوندێکە لە ناوچەی شوان– کەرکووك
٣ قولی بەگ، دیسانەوە گوندێك بووە لە ناوچەی شوان– کەرکووك
٤ مەلا کیژان، مەلای دێی ئالی بەیان بووە لەو کاتەدا.

ئــەوانیش وا لە دەس چــوون کەوتنە عەشــیرەتی شوان
جــارجــاریٚ دەنــگــی ئــەهــات زاتێکی خاوەن هیمــەت ([5])
گــەر نــاینــاســی پێت بڵێم مەشــهــووره مــام رەمــەزان
(لــوتــفــی) تــۆ خــەریکی چیت شیعرەکانت زۆر جوانە
بــەڵام منــیــش زانــیــوومــە خــۆتیش یــەکــێکی لــەوان

* * *

[5] مام رەمەزان دەروێش (شێخ حەسەنی قەرچیوار) بووە خاوەن دەنگو ئاوازێکی زۆر خۆش بووە.



## ئەی برادەر بۆ زویری

ئــەی بــرادەر بــۆ زویـــری خەم مەخۆ دونیای دوون
رزق و عومرو ئەجەلت نووسراوە بەینی کاف و نوون([1])
بــۆچ ئــەوەنــدە بــە پــەرۆشــی پــارە نــاکا راکە راك
نــە دڵت شــادبیٚ بە بــوون و نە خەمت بیٚ بە نــەبوون
گشــتی تــەقــدیــری خــودایــە خــالقی ئــەرز و سەما
ئاگــەداری خۆت بە گیانە خۆت مەخەرە چەندو چوون
خـــەم بــخۆ تــۆ ئەی برادەر کاکی خۆم ئەی بیٚ خەبەر
چــۆن ئــەزانی تــا ئــێوارە ساغ ئەبی یا ســـەرنگوون
چەن کەســـانێك وا ئـــەبیـــنم زۆر غـــرورو حاڵ نەزان
وەك تری لـــەو رۆژەدا کـــوژراوە فـــەوتـــاوە زەبـــوون
چۆن لـــە مـــەکـــری خوات ئەمبینی وا بیٚ باکی ئەرۆی
وا دەمیٚ تـــر تۆ ئـــەبینم دووچـــاری ناو چاك و خوون
(لــوتــفی) دەردی خۆت دەواکــە ماڵ وێرانی بیٚ خەبەر
چەن هـــەزارانی وەکووو توو کەوتە داوی هات و چون

* * *

[1] کاف و نوون– ئیشارەیە بۆ ئایەتی ٨٢ لە سورەتی یاسین کە دەفەرمویٚ: "انما امرە اڎا اراد شیئأ ان یقول لە کن فیکون".

## دڵە شیوەن کە

دڵە شــیوەن کــە شــین بکــەرە بــەر
خۆت بکە بە خــاك خــاك بکە بەسەر
بۆ خــۆت بناڵــە هــەتــاکوو مــاوی
لە مــاڵو لە چۆڵ لە دەشتو لە دەر
بگریە بۆ خۆت دونیات لەدەس چوو
کاتی مردن هــات وای ئەینەل مەفەر
نــازانـــی داوی مـــەرگــت چ جــۆرە
وەك تەیـری هــەژار لە داو بێ خەبەر
ئایا بە ســـووتانو یــا خــۆ خنکان
وەیــا بــە نــاحەق کوژراوی بێ سەر
ئەبێ هـــەر بڕۆیی چــارت ناچــارە
تەمـــەنی جـوانی ئـەوا چووە سەر
ئەمجــا بە ڕاســـتی رووبکە خودات
هـــاوارکــە دەخیل خـــالقی ئەکبەر
جێی هـــاناو هاوار لە هەردوو دونیا
بەڕاســـتی هەر تووی بینایی دادگەر
ڕۆژو شـــەو بە تــاو مردن دێ بۆ لام



یەکجار ئەترســـم لــە ڕێی پڕ خەتەر
تـــازە مــن چی بکـەم چیم دەسەڵاتە
پەنا بـــە دەرگـــای ســەیدی سەروەر
ئەژنۆم شکـاوە لــە ژێـر بـاری خەم
لەترسو دەهشـەت لەڕۆژی مەحشەر
لە پرســـیاری حــەق وەڵامـــم چییە
هەر خـــۆت عـالیمی لە حاڵی بەشەر
نەمـــامی تـــەوبــە لـــە دڵ بڕوێنە
بەناوی خـودای گـــەورە دێتـــەبــەر
(لـــوتــفـــی) ئــەزانی بـارت گــرانە
حـــووبـــی دونیایی لە دڵ دەرکەدەر

*  *  *

## ئەوا کۆچی کرد

ئەوا کۆچی کرد مانگی رەمەزان
ئەو کەسەی خواردی ئەوبوو پەشیمان
بێبەش لە خەیری رۆژوبوو ئەو کەس
ئەو رەنج خەسار بوو لەهەردوو جیهان
جەژنە ئەوا هات بە خۆشیو شادی
یاخوا بە خێربێ جەژنی موسڵمان
خوایە بە شەرەف حەزرەتی رەسووڵ
ئەمنو ئاسایش بۆمان کەی نیشان
ئەوەندەی توانیم هەوڵم تیا داوە
بە وێردو نوێژو خوێندنی قورئان
گەرچی گوناهم وەك چیا وایە
بەڵام رەحمی تۆ بێ حەدوو پایان
دەستەڵات لە دەس بەندە چی هەیە
غەیر رجا کردن لە دەرگەی یەزدان
خۆزگەم بەو کەسەی ئەکەوێتەبەر
شفاعەتی ئەم مانگەی رەمەزان
مەغفیرەت بۆ ئەو دێتە خوارەوە



سەربەرزو دڵ خۆش لە هەردوو جیهان
من ماڵ کاولم زۆر بارگرانم
لە ئەمرو نەهی زۆرم هەن نوقسان
(لوتفی) بگریە مەخەو رۆژو شەو
بناڵە بۆ خۆت شەو هەتا بەیان

رەمەزانی ١٩٦٥ وتراوە

* * *

## فکر لە کردەی (١)

فکر لە کردەی خالقی یەزدان
بکەرەوە تۆ هەی خانە وێران
بزانە چی بوو ئەمساڵ لە دونیا
تەنها یەك مانگی تەئخیر بوو باران
گیان لەبەر بێ خوێن تاقەتی برا
دڵ عالەم بای خوارد وەکوو ژێی کەوان
میللەت دڵ تەنگ بوو بە جارێ شێوا
هەموو ئەسووڕان چاو پڕ لە گریان
زەوی وشك بوو درەختو گیای
بۆنی خوێن ئەهات لە ئەرزو ئاسمان
لە تاو برسێتی هەموو حەیوانات
سیس و لاواز بوون مردن لە برسان
گوناه خۆمانە هەموو دووچارین
تەئسیری کردووە لە گشت بەستەزمان
لە بەحری کەرەم خودایی کەریم
کراسی تازەی کردە بەر جیهان
بارانی رەحمەت لە هەر چوار کنار
هێنای بە جارێ بەسەریا رژان

[1] لە ساڵی ١٩٦٤دا ماوەیەکی گەلێ زۆر دنیا وشكو بێ بارانی بوو هەموو شتێ بەرەو گرانی دەچوو مەڕو ماڵات بێ لەوەڕ... دەغڵو دان سیسو کز بوو هەموو کەس دڵ تەنگ و خەمگین بوو (لوتفی)ش بەو هۆیەوە ئەم پارچە شیعرەی سەرەوەی وتووە.



کوردینە توو خوا قەت غافڵ مەبن
لە شوکرو زیکری خالیقی یەزدان
شەوو رۆژ بە دڵ زیکری خوداکەن
قەت تەواو نابێ نیعمەتی رەحمان
هەر کەس ئەمین بێ لە مەکری خودا
مەعلوومە هەر ئەو لە قەلبی شەیتان
لە هەردوو دونیا بێبەشو روو رەش
لە مەیدانی حەق ئەوە ماڵ وێران
نەدەس بەردار بە تۆ لە رەحمەتی
نە ئەمنیش بە لە کەیدی جیهان
(لوتفی) بناڵە بۆ خۆت رۆژو شەو
بەڵکو عەفوت کا پادشای مەنان

* * *

## لەتاو جەوری زەمانە(١)

لە تاو جەوری زەمانە هەر لە زارم یا رەسوڵ اللە
وەکوو پەروانە هەردەم بێ قەرارم یا رەسوڵ اللە
لەغەیری تۆ بەرەو لای کێ بچم ئەی خۆشەویستی خوا
لە کۆمەڵ دوورو دائیم دەر کەنارم یا رەسوڵ اللە
روو رەش‌و عاسیم هەمیشە من لە ئەمری زاتی حەق
خەسارەت مەندو بێ مایەو هەژارم یا رەسوڵ اللە
موودەیێکی زۆر بەبێ هەستی‌و نەفامی رامبوارد
بەفیرۆ چوو لە دەس من نەوبوهارم یارەسوڵ اللە
بەسەر چوو رۆژگاری من لە ناو دەریای نەزانیدا
لە راست ئەعمالی کۆنم شەرمەزارم یا رەسوڵ اللە
لە تاریکی شەوی غەفڵەت هەتاکەی گۆشەگیری کەم
لەناو جەیشی خەفەت بێ دۆست‌و یارم یاڕەسوڵ اللە
بە رۆژو شەو لە قاپی ئەو وەرە (لوتفی) بناڵێنە
هەموودەم تۆ بڵێی خزمەتگوزارم یا ڕەسوڵ اللە

*   *   *

[1] ئەم پارچە شیعرە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە



## لە گوێم دێ(١)

بیستوومە کە غەوغایی پەیدا بوو لەولایە
پرسیم لە موسڵمان چییە ئەم دەنگ‌و سەدایە
لە گوێم دێ دەنگی دەف‌و تەپڵ‌و سەڵاوات
شین‌و گریان‌و فیغان ئەڵێی رۆژی جەزایە
کەچووم چاوم پێ کەوت دووسەد وەجبە مەخلووقات
هەمووی وا دێ بەڕێدا بە سواری هەم بە پایە
هەندێ بە سواری مایین بەعزێ ئەسپی لەبن دا
بەعزێ سواری نێرەکەر هەندێکیشیان بە پایە
یەکێ هەگبەی لە تەرکی کاوو جۆی لەناوە
نان‌و خورمایان پێیە ئەسپابییان موهەبأیە
سەفێکیان شمشێر بەدەس لە پێشی ئەو عالەمە
بەیداغ بە دەستیان لەگەڵ ئەڵێی رۆژی غەزایە

١ پایزی ساڵی ١٩٣٥دا جەنابی شێخ عەبدولکەریمی شێخ مستەفای شێخ ئەحمەدی بەرزنجی لە دێی (دارەخورما)وە ئەچێت بۆ ناوچەی قادر کەرەم بە مەبەستی تەریقەتدان‌و ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان‌و خەڵکی ئەو ناوچەیە لا ئەداتە دێی (کەڵوڕ)ی ناوچەی بیبانی کۆمەڵێکی گەلێ زۆریش پیاو ماقوول و خەلیفەو دەروێشی لە خزمەتدا ئەبێ (لوتفی) ئەم غەزەلەی سەرەوەی بەو هۆیەوە وتووە

دەروێشی (شێخ حەسەنن) (پیری قادر کەرەمە)
رەئیسیان عەبدولکەریم شێخی (دارە خورما)یە
تەبلیغ ئەکا بە خەڵکی تەوبە بکەن فرسەتە
دونیا زۆر بێ وەفایە نیعمەتی بێ بەقایە
هیچ پشتی پێ مەبەستە بەم عومرەکەمو کورتە[1]
پێی خۆشحاڵ مەبە هەرگیز چونکە روو لە فەنایە
ساخودایە دەخیلە بە دەرگاهی بەرزی تۆ
تەوبەم لێ قەبووڵ بکەی یەکجاری رووم سیایە
بەسە (لوتفی) مەگریە گریانی تۆ بێ سوودە
لەمەودوا سەرف بکە عومری خۆت لە تەقوایە

* * *

[1] ئەم تاکە دێرە لە چاپی یەکەمدا چاپ نەکراوە.



## ئەی خودایە

ئەی خودایە روو لە کوێ کەم غەیری تۆ قەت کەس نییە
شیوەنو گریانو ئاهم بۆ گوناهم بەس نییە
گەر ئەبیسن ئەی رەفیقان ناڵەی پێش سەحەر
دەنگی هاواری منە دێ ناقووس و جەرەس نییە
نەوعە ئینسانێ هەیە لۆمەم ئەکا بەبێ دەلیل
گەر خەبەردار بێ ئەزانی رەنجەکەم عەبەس نییە
لازمە بۆ من کە فیکری کەم لە کردەی خوای مەزن
تەگبیری ئەو رۆژە کە کەس بۆ کەس قەت کەس نییە
عالەمی وردو درشت گشتی لە شینو زارییە
رۆژێ کە ئەو رۆژە لای کەس قەتعیەن هەوەس نییە
دەشتی مەحشەر جۆش ئەخواتن هەر لەتاوی گەرمی رۆژ
وەی خودا هاوارە رەحمێ کە رێگەی نەفەس نییە
(لوتفی) غەیری فەخری عالەم روو لە دەرگای کێ ئەکەی
غەیری ئەو لە رۆژی مەحشەر کەس فریادڕەس نییە

* * *

## ئەی رەئیسی جەمعی مەخلووق

ئەی رەئیسی جەمعی مەخلووق شاهی شاهانم وەرە
ئەی ئەمیری هەردوو دونیا مەردی مەیدانم وەرە
زۆر زەلیلو دڵ پەشێوم غەرقی بەحری میحنەتم[١]
رابەری رێگەی نەجاتو ماهی درەخشانم وەرە
من گوناهبارو خەجاڵەت روو رەشی رۆژی جەزام
خاوەنی عزو شەرەف تۆی روح بە قوربانم وەرە
خاتری روخساری نورینی جەنابت خوای مەزن
ئەرزو ئاسمانی دروست کرد چاو بە گریانم وەرە
من ئەزانم کردەوەی چاکەم نییە ساچی بکەم
رەحمەتیٚ فەرموو گەدام بۆ ماڵی وێرانم وەرە
من ئەوەندە هەوڵ ئەدەم نەفسم لە دەستم دەرچووە
چی لە مەیلی نەفسی بەد کەم جانی جانانم وەرە
گەر لەمەولا خوا بە خۆی رەحمیٚ بکاتە حاڵی من
نەفسی بەدکارم ئەکوژریٚ دڵ بە قوربانم وەرە
هەروەکوو سیروان لە چاوم ئاو ئەچۆڕیٚ بیٚ وچان
روو رەشی دونیاو قیامەت دەستەدامانم وەرە
(لوتفی) بەس شیوەن بکە بۆت ناگیریٚ نەفسی بەدت
شاهی لەولاک بێتە ئیمداد نووری ئیمانم وەرە

[١] ئەم تاکە دێڕە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.



## ئەی رەفیقی خۆشەویستم

ئەی رەفیقی خۆشەویستم ماڵی خۆت وێران مەکە
هەر بەگوفتی هیچو پووچیش باری خۆت گران مەکەم
وا لەسەر رێگایەکی راستو بەرینی چاوەکەم
ئاگادارو باخەبەر بە روو لە کەندەڵان مەکە
چونکە نەفسی توو بەدائیم مائیلی کاری خراپ
دەوری ئیمانت زەعیفە خۆت تووشی شەیتان مەکە
بۆچی مەغرووری عەزیزم سەد هەزاری وەکوو تۆ
هاتو رۆیی بە رەزیلی تۆ دڵت خەندان مەکە
فیکری حاڵی قەبری تەنگو مردنو کفنی سپی
وا لە رێتە بێنە یادت قەتعیەن غەڕان مەکە
دڵ بە زۆر راکێشە بۆ لای تاعەتی یەزدانی خۆت
نەفس دائیم دڵ فریبە بە قسەی پەیمان مەکە
بۆچی وا داماوی (لوتفی) عومرەکەت چووبیٚ سەمەر
هەڵسە ئیتر پەیڕەوی خاسان بکەو گریان مەکە

*       *       *

## خەیاڵم وا ئەڵێ ئیمرۆ

خەیاڵم وا ئەڵێ ئیمرۆ خەمی دونیا لە دڵ دەرکە
تەماعی حۆریو غیلمان شەرابی نەهری کەوسەرکە
هەتاکەی وا لە غەفڵەتدا خەریککی بەزمی دونیایی([1])
ئیتر بەس وەسفی روخسارو قەدو باڵای دولبەرکە
لە جێی (فاسونی جەرمانی لە ناو عالەم لەبۆ دەعیە
کراسێکی سپی (چادر) لەبەر کەو تف لە مەخمەرکە
مەڵێ چەتفەو عەگاڵ چاکە جەمەدانی لەگەڵ هەوری
کڵاوێکی دڕاو شڕ پەیاکەو توو لەسەر سەرکە
هەتا ئەتوانی سەر هەڵگر بڕۆ بۆ خۆت لە دونیادا
تەماشای سونعی باری کە بە دائیم زکری ئەکبەر کە
هەزاران عادەتو تەرتیب و تەنزیماتی دا ناوە
ئەبینی سەنعەتی یەزدان دڵو دینت بەرانبەرکە
مەڵێ ماڵو منداڵو ژن بە جێ بێڵم چە کارێکە
هەموو کەس هەربەجێ دێڵی ئەتۆش نەفست موکەدەرکە
بە ڕۆژو شەو بڵێ یارەب دەخالەت روسیاهم من
بە روو زەردی لە قاپی خوا گەدایی ڕۆژی مەحشەرکە
هەتا ئیمرۆ ئەوەی چوو پارە ناکا قەت لە بۆت (لوتفی)
لەمەولا ئەشکی چاوانت بەسەنگی دووڕو گەوهەر کە

---

[1] ئەم تاکە بەیتە شیعرە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.



## لەسەر جێ ناساغ

لەسەر جێ ناساغ وەعدی سەفەرمە
سەفەر یەکجاری روو لە خەتەرمە
دەردی مردنە وا جەستەمی گرت
ئەڵێی ئاگرەو لە ناو جگەرمە
ئەعزام ئەسووتێ وەك كأورەی ئاگر
هەوای عزرائیل وەکوو سێبەرمە
هیچ گوێ نادەمە گریانی منداڵ
چونکە خەفەتی مردن لەبەرمە
ئەزانم ئەمرم رزگارم نییە
وەکوو چۆلەکەی چنگی سەقەرمە
ژن بۆ مارەیی نووکە نووك دەکەن([1])
مەلا بە تەمای کەواو مێزەرمە
کوڕەکان هەموو ئەڵێن باوکەڕۆ([2])
حازرە بۆ بەش مەڕو گاو کەرمە
کوێرو شەل بیستیان هەموویان هاتن
ئیسقات ئەکرێ بۆی بەم گەرماو گەرمە

---

[1] – [2] – ئەم دوو دێڕە شیعرە لە چاپی یەکەم بڵاونەکراوەتەوە.

سەگو پشیلە کەوتنە هاتوچۆ
بۆ کەرتێ ئێسقان یا پارچەی چەرمە
منیش داخل بووم بە ژێر ئەو خاکە
ساخودا ناوت وێردی سەحەرمە
(لوتفی) تا ماوی خاک بەسەر داکە
بڵێی پەنای حەق خەیرول مەقەرمە



## بە فریام کەوە[١]

بە فریام کەوە ئەی یەزدانی تاک
لەم ژینە گەلێ پەشێوم خەمناک
هەموو شت لای تۆ بە کونفەیەکون
دەتوانی جیهان بکەی بانو بن
هەزاران هەزار جۆرە روح لەبەر
دروستت کردووە لە بەحرو لەبەڕ
منیش عەبدی تۆم هەژارو داماو
تیمار کە دەردەم ئەی بینای چاو
تاکەی بەم جۆرە ئەم ژینە تاڵە
ئازار بچێژم ئەمن بەم حاڵە
سەبری ئەیوبم لە کوێ بوو قوربان
هیچ شتێ لای تۆ خۆ نییە پەنهان
پێمان عەتاکە قەترەیێ رەحمەت
(لوتفی) دەناڵی ناو بەحری میحنەت

* * *

[١] ئەم پارچە شیعرە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.

## پەنا بە دەرگات(١)

پەنا بەدەرگات شای خەیرول بەشەر
لە دونیاو عوقبا هەر خۆتی رابەر
ئەگەرچی زۆرە جورمو گوناهم
لە خزمەت باری من رووسیاهم
هەتا گەردنم ناو بەحری عوسیان
رجام قەبووڵ کە دەستم بە دامان
خۆت شەفیعم بە ئەی عالی مەقام
چونکە سەرتاپا من غەرقی خەتام
بەڵکو لە سایەت ئەی نووری بەسەر
بگەم بە مەرام لە رۆژی مەحشەر
باری سەرشانم گەلێ گرانە
دەردم کوشندە بەبێ دەرمانە
گوناهم زۆرە بێ حەدو ئەژمار
گەلێ مەلوولم بۆ رۆژی پرسیار

[١] ئەم پارچە شیعرە لە چاپی یەکەمدا بڵاونەکراوەتەوە.



وەها شێواوە شعوورو هەستم
دەبینی دائیم وەك گێژو مەستم
دەفتەرم سیاه زۆر شەرمەزارم
چاوەڕێی رەحمی پەروەردگارم
مەگەر هەر بە خۆی رەحمێ بنوێنێ
رزگارم بکاو خەمم نەمێنێ
ئەگینا (لوتفی) زۆر پەرێشانە
بۆ حاڵی زاری هەر لە گریانە

* * *

## خاكی رەهگوزەر

ئەی دڵ راپەڕە شینێ بەرپاكە
خاكی رەهگوزەر بەسەر خۆتاكە
هەتا ئەتوانی بە رۆژو بە شەو
رێی چاكە بگرە لە دەرگانەی ئەو
گوناهت زۆرە لەحەد چووە دەر
پەنا هەر ئەتووی بینای دادگەر
پشتت ببەستە بە رەحمی خودا
روو بماڵە خاك بە ترس و رجا
بە خواردن و خەو رۆژ مەبەرە سەر
عومر بچوێنە بە ترس و خەتەر
خاك بەسەر داكە وەك برا مردوو
دونیا نامێنێ نە بۆ من نە توو
زیكرو عیبادەت مایەی ئیمانە
تەركی حەرام و درۆو بوهتانە
سەرف كە عومر لە كردەی شیرین
قەت مەكە هاوڕێی پیاوی كەم دێن
چاو چنۆك مەبە تەماع كار رەزیل



بۆ جیفەی دونیا خۆت مەكە زەلیل
بەرگی قەناعەت بكەرە بەرت
تاجی سەربەستی بنێ سەر سەرت
(لوتفی) دەردەكەت زوو بكە دەرمان
با لە قیامەت نەبێ دڵ گران

* * *

